**1**/ لەدەستە چەپ وەك لە وێنەكەشدا دیارە ئەو بەشەمان پیشان دەدات كە دەمانەوێت(پرێتن) ی بكەین.

| زنجیره | ناو | تەمەن | ژمارەی مۆبایل | مووچە |
|---|---|---|---|---|
| 1 | هەردی | 12 | 7701500212 | $ 1,200.00 |
| 2 | احمد | 19 | 7701500212 | $ 130.00 |
| 3 | محمد | 13 | 7701500212 | $ (940.00) |
| 4 | شاد | 20 | 7701500212 | $ (2,010.00) |
| 5 | كاروان | 23 | 7701500212 | $ (3,080.00) |
| 6 | ئازاد | 21 | 7701500212 | $ (4,150.00) |
| 7 | ئاری | 12 | 7701500212 | $ (5,220.00) |
| 8 | ئارام | 34 | 7701500212 | $ (6,290.00) |
| 9 | هەردی | 34 | 7701500212 | $ (7,360.00) |
| 10 | احمد | 45 | 7701500212 | $ (8,430.00) |
| 11 | محمد | 67 | 7701500212 | $ (9,500.00) |
| 12 | شاد | 41 | 7701500212 | $ (10,570.00) |
| 13 | كاروان | 21 | 7701500212 | $ (11,640.00) |
| 14 | ئازاد | 21 | 7701500212 | $ (12,710.00) |
| 15 | ئاری | 21 | 7701500212 | $ (13,780.00) |
| 16 | ئارام | 23 | 7701500212 | $ (14,850.00) |
| 17 | هەردی | 20 | 7701500212 | $ (15,920.00) |

**2**/ ئەم ئایكۆنە بەكاردێت بۆ پرێنت كردن.




**3**/ لێردا ژمارەی ئەو نوسخانە یان ئەو دانانە دیاری دەكەین كە بۆمان پرێن بكات.

بۆ نمونە:- ئێمە(**5**) لاپەرەمان هەیە دەمانەوێت (**10**) دانەی لێ پرێن بكەین لێرەدا دەنوسین(**10**)

Print

Copies: 1

**4**/لێرەدا ئەو پرێنتەرە دیاری دەكەین كەدەمانەوێت ئەم كارەی پێبكەین لەوانەی لەم كاتەدا چەند پرێنتەرێك بەسرابێت بە كۆمپیتەرەكەمانەوە.



**5/** لەم بەشەدا دەتوانین لاپەرەکانمان پرێنت بکەین لەوشوێنەوەی خۆمان دەمانەوێت تا شوێنێکی تر.

نموونە:- ئێمە (**30**) لاپەرەمان هەیە دەمانەوێت لاپەرەی (**15**) تا لاپەرەی (**20**) پرێنت بکەین لێرەدا دەینوسین (**15**) بۆ (**20**).

Pages: 15 to 20

سەرنج

ئەگەر بمانەوێت تەنها یەك لاپەرە پرێنی کەین لە ناو کۆمەڵێ لاپەرەدا بۆ نمونە تەنها لە پەرە (**8**) ئەوا دەنوسین لە (**8**) بۆ(**8**).

Pages: 8 to 8

**6/** ئەم بەشە بەکاردێت بۆ جیاکردنەوەی لاپەرکان لە کاتی پرێنت کردندا.

نموونە:- ئێمە (**10**) لاپەرەمان هەیە دەمانەوێت (**5**) جار بۆمان پرێنت بکات لێرەدا ئەوە دیاری دەکەین کە (**10**) لاپەرەکەمان بۆ پرێنت بکات جارێك ئینجا بۆجاری دووەم و سێیەم دوبارەی بکاتەوە یان لاپەرەی یەکەم (**10**) جار پرێنت بکات بۆمان ئینجا لاپەرەی دووەم (**10**) جار بە هەمان شێوە.

Collated
1,2,3 1,2,3 1,2,3

Uncollated
1,1,1 2,2,2 3,3,3

**7/**لەم بەشەدا دەتوانین لاپەرەکە هەڵ بژێرین لەباری درێژی یان پانیدابێت.




**8**/لەم بەشەدا قەبارەی لاپەڕەکەمان هەڵ دەبژێرین(....**A4,A3**).




## چۆنیەتی خەزنکردنی پرۆژەکانمان

خەزن کردن واتا پاشەکەوت کردنی داتاکانمان و مانەوەی لەناو کۆمپیتەرەکەمان بۆماوەیەکی درێژ خایەن وە ئەگەر پێویستمان بوو دەتوانین جارێکی تر بیکەینەوە گۆرانکاری تێدا بکەین.

ئایکۆنی **(Save)** دەکەوێتە لیستی **File** یان دەتوانین لەسەر کیبۆرد دوگمەی **(Ctrl+S)** دابگرین ئەم بەشەمان بۆ دەکرێتەوە.



پرسیار:- چۆن بتوانی پرۆژەیەك خەزن بکەین وە ووشەی نهێنی بۆ دابنێین؟

وەڵام:- بەم هەنگاوانەی خوارەوە:-

**1/**سەرەتا دەچینە سەر لیست **(File)** پاشان **Save** هەڵدەبژێرین.

**2/**لە بەشی خوارەوە دەچینە سەر **(Tools)** پاشان **(General Option)** هەڵدەبژێرین.

**3/** پاشان لە بۆشای یەکەمدا ووشەی نهێنی دەنوسین لە دووەم دا دوبارەی دەکەینەوە.






# بەشی دووەم

# کردارە بیرکاریەکان

بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ گرنگیەکی زۆری هەیە لە بواری حسابات و ژمێریار یدا ، چونکە هەموو کردارە بیرکاریەکان دەتوانرێت لەم بەرنامەیەدا ئەنجام بدرێت بە باشترین شێوەوە زۆربەئاسان هەرکردارێك بتەوێت دەتوانیت ئەنجامی بدەین.

کردارە بیرکاریەکان :-

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| دابەشکردن | / | 3/9 | = | 3 |
| لێکدان | * | 3*2 | = | 6 |
| کۆکردنەوە | + | 3+2 | = | 5 |
| لێدەرکردن | - | 2_4 | = | 2 |

بەردەوام بە لەگەڵمان

بەردەوام بە لەگەڵمان

بەردەوام بەلەگەڵمان

بەردەوام بە لەگەڵمان

## ریزبەندی کرداره بیرکاریەکان (اریرك اریەکان)

لەکاتی ئەنجام دانی کرداره بیرکاریەکاندا دەبێت رەچاوی ئەوخاڵە بکەین کە ئەویش ریزبەندی کردارەبیرکاریەکانە.

ئەم زاراوەیەش واتە کام کردار لە کرداره بیرکاریەکان پێش کردرەکەی تر رودەدات واتە ئێمە سێ کردار یان زیاتر ئەنجام بدەین دەبێت بزانین کام کرار لە پێش کردارەکەی ترەوە ئەنجام دەدرێت.

ریزبەندیەکە بەم شیوەیەیە:-

ئەگە ئێمە نمونەیەکی لەم چەشنەمان هەبێت:-



## (جۆری کرداره بیرکاریەکان)

کرداره بیرکاریەکان لەم بەرنامەیەدا بەدوو جۆر ئەنجام دەدرێن:-

یەکەم:- کرداره بیرکاریەکان بەپێی ژمارەی ناو خانەکان:-

ئەم رێگایە هەرچەندە رێگایەکی باش و سەرکەوت و نیە بە لاَم ئێمە هەر ئاشناتان ئەکەین پێی، ئەم رێگایە واتە ئەنجام دانی کردارەکان بەپێی ئەو ژمارەی کەلەناو خانەکەدا هەیە، واتە لەکاتی ئەنجام دانی کردارەکاندا ژمارەی ناو خانەکان بەکاردەهێنین بەم هەنگاوانەی خوارەوە وەك لەم نمونانەی خوارەوەدا دیارە.

**1**/ سەرەتا لەو خانەی دەمانەوێت ئەنجامی کرداره بیرکاریەکەی تێدا بنوسین نیشانەی یەکسانە(**=**) دادەنێین.

**2**/ژمارەی یەکەم دەنوسین پاشان کرداره بیرکاریەکە پاشان ژمارەی دووەم ،وە دەتوانین چەند کردارێك بەیەکەوە ئەنجام بدەین. پاشان ئینتر دەکەین لەسەر کیبۆردی کۆمپیتەرەکەمان راستەوخۆ ئەنجامەکەمان دەداتێ.

| ئەنجام | شێوازی نوسین | ژمارەی دووەم | ژمارەی یەکەم | کرداری بیرکاری |
|---|---|---|---|---|
| 7 | =3+4 | 4 | 3 | + |
| 1 | =5-4 | 4 | 5 | - |
| 2 | =4/2 | 2 | 4 | / |
| 12 | =3*4 | 4 | 3 | * |
| | لەم شێوازەدا ئێمە پشت دەبەستین بە ژمارەی ناو خانەکان | | | |

**سەرنج**

لە لایەنی خراپەکەی ئەم شێوازە لە کردە بیرکاریەکاندا ئەوەیە کە لەکاتی گۆڕینی ژمارەکانی ناوخانەکە لەدوای ئەنجام دانی کردارە بیرکاریەکە ئەوا ئەنجامەکە ناگۆڕێت ، دەبێت گۆڕانکاری لە کردارەکەدا بکەیت.

دووەم:- ئەنجام دانی کردارە بیرکاریەکان بەپێی خانەکان:-

ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی گرنگ و سەرکەوتوە بۆ ئەنجامدانی کردارە بیرکاریەکان لەم ڕێگەیەدا پشت دەبەستین بە خانەکان واتە ئێمە کردارەبیرکاریەکان لەسەر خانەکان ئەنجام دەدەین بەم هەنگاوانەی خوارەوە.

**1**/سەرەتا نیشانەی یەکسان (=) دادەنێێن .

**2**/ناوی ئەو خانەیە دەنوسین کەژمارەکەی تێدایە یان کلیك لە خانەکە دەکەین ڕاستەوخۆ ناوەکەی دەنوسرێت خۆی.

**3**/نیشانەی کردارە بیرکاریەکە دەنوسین ،پاشان ناوی خانەی دووەم دەنوسین پاشان ئینتەری کیبۆردەکە دادەگرین ڕاستەوخۆ ئەنجامەکەمان دەداتێ.

بۆ ڕون کردنەوەی زیاتر سەیری ئەم وێنەیەی خوارەوا بەکەن



| ئەنجام | شێوازی نووسین | ژمارەی دووەم | ژمارەی یەکەم | کردار بیرکاری |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| 5 | =G6+H6 | 2 | 3 | + |
| 1 | =G7-H7 | 4 | 5 | - |
| 6 | = G8*H8 | 3 | 2 | * |
| 2 | =G9/H9 | 3 | 6 | / |

لەم شێوازەدا ئێمە پشت دەبەستین بە ناوی خانەکان

## سەرنج

خوێنەری بەرێز ئەم رێگایە رێگایەکی سەرکەوت و ترە لەوەی پێشەوە چونکە لەم رێگەیەدا بە گۆرینی ژمارەی ناو خانەکە راستەوخۆ ئەنجامەکەش دەگۆرێت بە بێ ئەوەی ئێمەدەستکاریبکەین.

### بەکارهێنانی **(Drag and Drop)** ن لە کردارەبیرکاریەکا

ئەم کردارە واتە راکێشان بۆ سەرەو خوارەوە یان راکێشان بۆ لای راست و چەپ ئەم کردارە گرنگیەکی ئەوتۆی هەیە لە کردارە بیرکاریەکاندا چونکە ئێمە یەکجار کردارە کە لە خانەیەکدا دەنوسین پاشان بە ئەنجام دانی **(Drag and Drop)** دەتوانین بۆ هەموو خانەکانی تری ئەنجام بدەین

.

## رونکردنەوەی زیاتر لەم وێنەیە ببینە

سەرەتا کردرە بیرکاریەکەی دەمانەوێت ئەنجامی بدەین بۆ خانەی یەکەمی ئەنجام دەدەین بەو شێوەی لە وێنەکەی خوارەوەدا دیارە پاشان بە بەکارهێنانی کردارەکە بۆ هەموو خانەکانی تر ئەنجام دەدەین کلیك لەوخانەیە دەکەین کە ئەنجامەکەی تێدایە پاشان کە کێرسەری ماوسەکە بە شێوەی **(+)** لێهات رای دەکێشینە خوارە.

| زنجیره | نمرەی 1 | نمرەی 2 | کۆتا ئەنجام |
|---|---|---|---|
| 1 | 23 | 12 | =D7+E7 |
| 2 | 12 | 27 | |
| 3 | 11 | 26 | |
| 4 | 10 | 25 | |
| 5 | 9 | 24 | |
| 6 | 8 | 23 | |
| 7 | 7 | 22 | |
| 8 | 6 | 21 | |
| 9 | 5 | 20 | |
| 10 | 12 | 19 | |
| 11 | 13 | 18 | |
| 12 | 14 | 17 | |
| 13 | 15 | 16 | |
| 14 | 16 | 15 | |
| 15 | 17 | 14 | |
| 16 | 18 | 13 | |
| 17 | 19 | 12 | |

Drag & Drop

| زنجیره | نمرەی 1 | نمرەی 2 | کۆتا ئەنجام |
|---|---|---|---|
| 1 | 23 | 12 | 35 |
| 2 | 12 | 27 | 39 |
| 3 | 11 | 26 | 37 |
| 4 | 10 | 25 | 35 |
| 5 | 9 | 24 | 33 |
| 6 | 8 | 23 | 31 |
| 7 | 7 | 22 | 29 |
| 8 | 6 | 21 | 27 |
| 9 | 5 | 20 | 25 |
| 10 | 12 | 19 | 31 |
| 11 | 13 | 18 | 31 |
| 12 | 14 | 17 | 31 |
| 13 | 15 | 16 | 31 |
| 14 | 16 | 15 | 31 |
| 15 | 17 | 14 | 31 |
| 16 | 18 | 13 | 31 |
| 17 | 19 | 12 | 31 |

لە کاتی راکێشانی ماوسەکە بۆ خوارەوە راستەوخۆ پرۆگرامە کە هەڵ دەستێت بە ئەنجام دانی ئەو کردارە بیرکاریە هەر خانەو لەگەڵ خانەکەی تەنیشت خۆی واتە تا کۆتای **(A2+B2...A3+A4)**بکەین ئەوا ئەو راستەوخۆ **(B1+A1)**ئێمە ئەگەر

کردارەکە ئەنجام دەدات.

# بەکارهێنانی نیشانی($) لە کردارەکان

وەك لە لاپەڕەی پێشەوە باس مان کرد کە لە کاتی کرداری **(Drag & Drop)** بەرنامەکە ڕاستەوخۆ هەڵدەستێت بە ئەنجام دانی ئەو کردارە بیرکاریە لەگەڵ خانەکەی تەنیشت خۆی. نیشانەی**($)** بەکاردێت بۆ چەسپاندنی خانەکە جێگیرکردنی خانەکە لە کاتی **(Drag & Drop)**

لەم دوو وێنەی خوارەوەدا زانیاری زیاتر وەربگرە:-

| | Drag & Drop | | |
|---|---|---|---|
| ژمارەی یەکەم | | ژمارەی دووەم | ئەنجام |
| 12 | | 21 | 33 |
| 13 | ↔ | 22 | 35 |
| 14 | ↔ | 23 | 37 |
| 15 | ↔ | 24 | 39 |
| 16 | ↔ | 25 | 41 |
| 17 | | 26 | 43 |
| 18 | ↔ | 27 | 45 |
| 19 | ↔ | 28 | 47 |
| 20 | ↔ | 29 | 49 |
| 21 | ↔ | 30 | 51 |
| 22 | ↔ | 31 | 53 |
| 23 | ↔ | 32 | 55 |
| 24 | ↔ | 33 | 57 |
| 25 | ↔ | 34 | 59 |
| 26 | ↔ | 35 | 61 |
| 27 | ↔ | 36 | 63 |
| 28 | ↔ | 37 | 65 |

| | ($) | |
|---|---|---|
| ژمارەی یەکەم | 6 | ئەنجام |
| 12 | | =J6+$L$5 |
| 13 | | 19 |
| 14 | | 20 |
| 15 | | 21 |
| 16 | | 22 |
| 17 | | 23 |
| 18 | | 24 |
| 19 | | 25 |
| 20 | | 26 |
| 21 | | 27 |
| 22 | | 28 |
| 23 | | 29 |
| 24 | | 30 |
| 25 | | 31 |
| 26 | | 32 |
| 27 | | 33 |
| 28 | | 34 |

وەك لە وێنەکەی سەرەوە دا دیارە ئە گەر ئێمە بمانەوێت خانەیەك لەگەڵ کۆمەڵێك خانەدا کۆبکەینەوە، ئەوا دەبێت ئەو خانەی هەمانە جێگیری بکەین لە کاتی کرداری نەجوڵێت.

## شێوازی بەکارهێنانی نیشانەی ($) لەکردارەکاندا:-

**1/** دانانی نیشانەی (**$**) لەبەردەم ناوی کۆڵۆمەکە واتە حەرفەئینگلیزیەکە بەم شێوەیە (**$A1**).

لەم کاتەدا ئەگەر خانەکە راکێشین بۆلای راست و چەپ ئەوا خانەکەجێگیردەبێت.

**2/** دانانی نیشانەی (**$**) لەبەردەم ناوی رۆیەکە واتە ژمارە بیرکاریەکە بەم شێوەیە (**$1**).

لەم کاتەدا ئەگەر خانەکە راکێشین بۆ خوارە وەو سەرەوە ئەوا خانەکە جێگیر دەبێت.

**3/** دانانی نیشانەی (**$**) لەبەدەم هەردوو بەشەکە کۆڵۆم و رۆیەکەش بەم شێوەیە(**$A$1**) .

لەم کاتەدا خانەکە جێگیردەبێت ئەگەر راکێشان بکرێت لەسەرەوە بۆخوارەوە وە لای راست و لای چەپ ، کە ئەمەباشترین جۆریانە.

بەشی سێیەم
فەکشن لەبەرنامەی
مایکرۆسۆفت ئێکسڵ

(فەکشن چیەو چۆن بیهێنینە ناو بەرنامەکەوە)

فەکشن بریتیە لە کۆمەڵێك شێواز کە ئامادەکراو لەلایەن کۆمپانیای مایکرۆسۆفت تەوە دانراوە لەم بەرنامەیەدا ، هەر یەکێك لەم فەکشنانەن بەکاردێت بۆ ئەنجام دانی کردارێکی دیاریکراو.

چۆنیەتی هێنانی فەکشن بۆ ناو بەرنامەکە:-

**1/** بەنوسینی راستەوخۆی فەکشنەکە لەناو ئەو خانەی کەدەمانەوێت. بەڵام دەبێت نیشانی یەکسان **(=)** مان بیر نەچێت.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| =sum(A1:A10) | =If(logical-test,value | | | if true,value | if falls) | |
| =Avarege(A1:A10) | | | | | | |

**2**/بەکلیك کردن لە نیشانەی (**FX**)لە بەشی سەرەوە لای ( **Formula Bar**)کە

راستەوخۆ بۆکسێك دەکرێتەوە لەوێدا فەکشنەکە هەڵدەبژێرین.






3/ بە چونە سەر لیستی **(Formulas)** لەم بەشەدا هەموو فەکشنەکانی ناو بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ کۆکراونەتەوەو پۆلێن کراون بەپێی شێوازو گرنگی بەکارهێنانیان.




................

کاتێك زانا لە ترسدا بێدەنگ بێت و نەزانیش هەر نەزان بێ

ئەی ئیتر چۆن راستی ئاشکرا دەبێت.

.......

مرۆڤەکان پێویستیان بە زانست هەیە هەروەك چۆن پێویستی

بە نـــــان و ئـــــاو هەیە.

.......

زانست لە کەسێك وەرمەگرە کە پارەو سامانی لەسەر وەردەگریت

........

ئیمامی احمد (ر.خ)

## ...فەکشنی(SUM)Fuction ...

ئەم فەکشنە یەکێکە لە فەکشنە گرنگەکانی بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ کە بە کاردێت بۆ کۆکردنەوەی خانەکان.

شێوازی بەکارهێنانی ئەم فەکشنە:-

**1**/سەرەتا نیشانی یەکسانە دادەنێن لەو خانەی دەمانەوێت پاشان بە یەکێك لە رێگاکانی سەرەوە فەکشنەکە دەهێنینە سەر روکاری بەرنامەکە.

**2**/پاشان ناوی ئەو خانەیە دەنوسین کە دەمانەوێت کۆی بکەینەوە یان کلیك لە خانەکە دەکەین.

**3**/پاشان نیشانەی (:) دادەنێین کە لەهەندێ لە پرۆگرامەکان ئەم نیشانەیە دەخوێنێتەوە (؛).

**4**/پاشان ناوی خانەی دووەم دەنوسین کە دەمانەوێت لەگەڵ خانەی یەکەم کۆبکەی نەوە کلیك لە ئینتری کیبۆردەکە دادەگرین راستەوخۆ ئەنجامەکەمان پێدەڵێت.

| | A | B | C | D | E | F |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەکان | | | | شێوازی نوسین | ئەنجام |
| 2 | 2 | 3 | 5 | 7 | =SUM(A2:D2) | 17 |
| 3 | | | | | | |

وا تە هەر چی خانەیەك لە بەینی ئەو دوو خانەیەدایە راستەوخۆ کۆیدەکاتەوە

## فەکشنی.. Fuction(AVERAGE) ...

ئەم فەكشنە یەكێكی ترە لە فەكشنە گرنگەكانی بەرنامەی مایكرۆسۆفت ئێكسڵ كە ئەم فەكشنە بەكاردێت بۆ دەرهێنانی تێكرای (معدل) واتە ژمارەی ناو ئەوخانانە كۆدەكاتەوەو دابەشی ژمارەی خانەكانی دەكات راستەوخۆ.

شێوازی بەكارهێنانی فەكشنەكە:-

**1/** سەرەتا نیشانەی یەكسانە دادەنێین لەو خانەی دەمانەوێت ئەم فەكشنەی تێدا بنوسین.

**2/** پاشان ناوی ئەو خانەیە دەنوسین كەدەمانەوێت تێكراكەی دەربێنین یان كلیك لە خانەكە دەكەین.

**3/** پاشان نیشانەی (:) دادەنێین كە لەهەندێك لە بەرنامەكاندا (؛) دە بێت دابنێین.

**4/**پاشان ناوی خانەكەی تر دەنوسین یان كلیكی لێدەكەین. پاشان ئینتری كیبۆردەكە دادەگرین راستەخۆ ئەنجامەكەمان پیشان دەدات.

دەتوانین ئەم سێ هەنگاوە بە یەكجار بكەین بە ماوسەكە ئەوماوەیە دیاری دەكەین راستەوخۆ خۆی(:) دوو نوقتەكەشمان بۆ دادەنێت.

| | A | B | C | D | E | F |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەكان | | | | شێوازی نوسین | ئەنجام |
| 2 | 20 | 15 | 15 | 50 | =AVERAGE(A2:D2) | 25 |
| 3 | | | | | | |

## ...فەکشنی (Fuction(MAX...

یەکێکی تر لە فەکشنە گرنگەکانی بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ فەکشنی (MAX) کە ئەم فەکشنە بەکاردێت بۆ دەست نیشان کردنی گەورەترین ژمارە لە ناو کۆمەڵێك ژمارەدا.

### شێوازی بەکارهێنانی ئەم فەکشنە:-

**1/** سەرتا نیشانەی یەکسان لەو خانەیەدا دەنوسین کە خۆمان دیاریمان کردووە.

**2/** بەیەکێك لە ڕێگاکانی سەرەوە کە بانسمان کرد بە ئارەزوی خۆمان ئەم فەکشنە دەهێنینە سەر روکاری بەرنامەکە.

**3/** پاشان ئەو ماوەیە دیاری دەکەین کە دەمانەوێت گەورەترین ژمارەمان بۆ دیاری بکات تیایدا.

ئەویش یان ئەو ماوەیە بە ماوسەکە دیاری دەکاین یان ناوی خانەی یەکەم دەنوسین پاشان نیشانەی (:) دادەنێن پاشان ناوی خانەی دووەم دادەنێین، پاشان ئینتەری کیبۆردەکە دادەگرین ڕاستەوخۆ گەورەترین ژمارەمان بۆ دەست نیشان دەکات.

| | A | B | C | D | E | F |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەکان | | | | شێوازی نوسین | ئەنجام |
| 2 | 21 | 35 | 15 | 50 | =MAX(A2:D2) | 50 |
| 3 | | | | | | |

## ...فەکشنی (MIN)Fuction...

یەکێك ی تر لە فەکشنە گرنگەکانی بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ فەکشنی (MIN) ە ، کە ئەم فەکشنە بەکاردێت بۆ دەست نیشان کردنی بچوکترین ژمارە لە ناو کـۆمەڵێك ژمارەدا.

شێوازی بەکارهێنانی ئەم فەکشنە:-

1/ سەرەتا نیشانەی یەکسان لەو خانەیەدا دەنوسین کە خۆمان دیاریمان کردووە.

2/ بەیەکێك لە ڕێگاکانی سەرەوە کە باسمان کرد بە ئارەزوی خۆمان ئەم فەکشنە دەهێنینە سەر روکاری بەرنامەکە.

3/ پاشان ئەو ماوەیە دیاری دەکەین کە دەمانەوێت بچوکترین ژمارەمان بۆ دیاری بکات تیایدا.

ئەویش یان ئەو ماوەیە بە ماوسەکە دیاری دەکاین یان ناوی خانەی یەکەم دەنوسین پاشان نیشانەی (:) دادەنێن پاشان ناوی خانەی دووەم دادەنێین، پاشان ئینتەری کیبۆردەکە دادەگرین ڕاستەوخۆ بچوکترین ژمارەمان بۆ دەست نیشان دەکات.

| | A | B | C | D | E | F |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەکان | | | | شێوازی نوسین | ئەنجام |
| 2 | 70 | 20 | 100 | 10 | =MIN(A2:D2) | 10 |
| 3 | | | | | | |

## ...فەکشنی (Fuction(COUNT...

له باسكردنی فەکشنەکانی بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ بەردەوامین ئەم جارە کە باس لە فەکشنێکی گرنگ ئەکەین کە ئەویش(COUNT)ئەم فەکشنە بەکاردێت

بۆ بژاردنی خانەکان واتە هەر خانەیە لە خانەکان داتای تێدا داخڵ کرابێت لەو خانانەی کە ئێمە دیاری دەکەین ئەوا ژمارەی ئەو خانانەمان پێدەڵێت.

### شێوازی بەکارهێنانی ئەم فەکشنە:-

**1/** سەرەتا نیشانەی یەکسان لەو خانەیەدا دەنوسین کە دەمانەوێت ژمارەی خانەکانمان بۆ بنوسێت تیایدا.

**2/** بەیەکێك لە ڕێگاکانی سەرەوە کە باسمان کرد بە ئارەزوی خۆمان ئەم فەکشنە دەهێنینە سەر روکاری بەرنامەکە.

**3/** پاشان ئەو ماوەیە دیاری دەکەین کە دەمانەوێت بۆمان ببژێرێت .

ئەویش یان ئەو ماوەیە بە ماوسەکە دیاری دەکاین یان ناوی خانەی یەکەم دەنوسین پاشان نیشانەی (:) دادەنێین پاشان ناوی خانەی دووەم دادەنێین، پاشان ئینتەری کیبۆردەکە دادەگرین راستەوخۆ ژمارەی ئەو خانانەمان پێدەڵێت کەداتای تێدا داخڵکراوە.

| | A | B | C | D | E | F | G | H | I | J | K |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەكان | | | | | | | | | شێوازی نوسین | ئەنجام |
| 2 | 70 | 20 | 100 | 21 | 2 | 3 | ✗ | 12 | 10 | =COUNT(A2:I2) | 8 |
| 3 | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | | |

دەبینین لە وێنەکەدا دیارە ئێمە 9 خانەمان هەیە بەڵام لە ئەنجامدا نوسراوە (8) چونکە خانەیەکیان بەتاڵە

## ...فەكشنی (Fuction(IF...

له باسكردنی فەكشنەكان ئەم جارە ئەچینە خزمەت باسكردنی فەكشنێكی زۆر گرنگ كە ئەویش فەكشنی **(IF)** لە ڕێگای ئەم فەكشنەوە دەتوانین مەرج بۆ خانەكان دابنێین وە بەپێی ئەو مەرجەی كە خۆمان بۆمان داناوە كارێكمان بۆ بكات، جا ئەو كارەش كردارێكی بیركارییێت یاخود نوسینی تێكستێك بێت یا خود نوسینی ژمارە و حەرف و پیت و هێماو هەر شتێك بە ئارەزوی خۆمان.

چۆنیەتی بەكارهێنانی ئەم فەكشنە:-

**1**/سەرەتا لەوخانەی دەمانەوێت مەرجی بۆدابنێین نیشانەی **(=)** دادەنێن.

**2**/ بەیەكێك لە ڕێگاكان كە باسمان كرد ئەم فەكشنە دەهێنینە ناو بەرنامەكە.

**3**/ئەم فەكشنە لە سێ **(3)** بەش پێكهاتووە:-

**A_ Logical_Test**:-لەم بەشەدا مەرج بۆخانەكەمان دادەنێین كە ئەومەرجە یەكێكە لەم شێوانە كە خانەیەك گەورەتر یان بچوكتر یان یەكسان یان گەورەترو یەكسان یان بچوكترو یەكسان یان یەكسان نیە بە ژمارەیەك یان بە خانەیەكیتر.

بۆنمونە:- **(F1<>10 ,D1>= 50 ,A1=A2, A1<20, A1>1)**

**2/ Value if true**:- لەم بەشەدا ئەو كارە دەنوسین كە دەمانەوێت بۆمان بكات ئەگەر ئەو مەرجەی دامان ناوە هاتە دی ،جا ئەو كارانەش كە دەتوانین لێرەدا بینوسین (ئەنجامدانی هەموو كردارە بیركاریەكان، نوسینی تێكستێك یان دانانی یەكێك لە فەكشنەكان هەرشتێك كە خۆمان بمانەوێت).

**3/Value if falls**: - لەم بەشەشدا ئەو كارە دەنوسین كە دەمانەوێت بۆمان بكات ئەگەر مەرجەكە نەیەتە دی جائەو شتانەی كە لێرەشدا دەینوسین ئەم بەشانەن (كرداره بیركاریەكان، نوسینی تێكستێك،دانانی یەكێك لە فەكشنەكان)

سەرنج

ئه گەر تێکست واته پیت بنوسی ئەوا دەبێت

لەهەردوو بەشی(Value if falls,Vaue if true)

لەبەینی دەبڵ کۆتەیشن ("") دابینوسین.

## نمونه لەسەر فەکشنی (IF):-

ئەگەر ئێمه نمرەی خوێندکارانمان هەبێت بمانەوێت دەرچوو دەرنەچوو دیاری بکەین ئەوا له ڕێگەی ئەم فەکشنەوه مەرجێکی بۆدادەنێین.

| | A | B | C |
|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەکان | | ئەنجام |
| 2 | 20 | | کەوتووه |
| 3 | 67 | | دەرچووه |
| 4 | 44 | | کەوتووه |
| 5 | 90 | | دەرچووه |
| 6 | | | |
| 7 | شێوازی نووسین | | =IF(A2>=50,"دەرچووه","کەوتووه") |

نمونه دووەم لەسەر ئەم فەکشنه:-

ئەگەر ئێمه مووچەی فەرمان بەرانمان هەبێت بمانوێت هەرکەسێ (1ساڵ) خزمەتی هەبێت ئەوا(25000) بخاته سەر مووچەکەی ئەوانەی تر(50000) بخاته سەر موو چەکەیان.

| | A | B | C | D | E |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | زنجیره | ناو | مووچه | سالی خزمەت | کۆی موچە |
| 2 | 1 | ئاکام | $100.00 | 1 | $ 125.00 |
| 3 | 2 | محمد | $250.00 | 2 | $ 300.00 |
| 4 | 3 | ئامانج | $300.00 | 4 | $ 350.00 |
| 5 | 4 | کامەران | $450.00 | 1 | $ 475.00 |
| 6 | 5 | کوردستان | $150.00 | 5 | $ 200.00 |
| 7 | 6 | کاروان | $400.00 | 3 | $ 450.00 |
| 8 | 7 | هەرێم | $900.00 | 6 | $ 950.00 |
| 9 | 8 | هیوا | $120.00 | 1 | $ 145.00 |
| 10 | 9 | احمد | $200.00 | 4 | $ 250.00 |
| 11 | شێوازی نوسین | =IF(D2=1,C2+25,C2+50) | | | |

سەرنج

خوێنەری بەرێز ئەنجامدانی هەموو فەکشنەکانیش وەك کردارە بیرکاریەکان وایە تەنها بۆیەك  بۆ هەموو خانە کانی(Drag&Drop)خانە ئەنجامی دەدەیت پاشان بۆ خانەکانی تر بە کرداری

تر راستەوخۆ ئەنجامی دەدات.

## ...فەکشنی (Fuction(OR)&(AND...

لەباسکردنی فەکشنەکان دەمێنینەوە ئەم جارە باسی دوو فەکشن دەکەین بە ئەم دوو فەکشنەش گرنگی (AND)(OR)یەکەوە کە ئەوانیش هەردوو فەکشن

خۆیان هەیە کە ئەویش ئەوەیە دەتوانین ئێمە لە یەك مەرج زیاتر لە سەر دەمان توانی یەك مەرج (IF)خانەکان دابنێین وەك دەزانین لە فەکشنی

لەسەر خانەکان دابنێین بەڵام ئەم دوو فەکشنە دەتوانین(255)مەرج لەسەر خانەکان دابنێین.

### (AND)&(OR):-جیاوازی نێوان ئەم دوو فەکشنە

وەك باسمان کردکە ئەم دوو فەکشنە دەتوانین(255) مەرج بۆخانەکەمان دابنێین دا ئەگەر لەم (255)(AND)بەڵام جیاوازی ئەم دوو فەکشنە لەوەدایە لە فەکشنی

مەرجە یەك مەرجیان نەیەتە دی واتە لە یەك مەرجیان ئەو خانەی ئێمە نەگونجێ ئەگەرهەمو مەرجەکانیش(FALSE) ئەوا راستەوخۆ پرۆگرامەکە دەنوسێت

هاتەدی واتە خانەکەمان لەگەڵ ئەو مەرجانەدا گونجا کە بۆمان داناوە ئەوا (TRUE).راستەوخۆ پرۆگرامەکە دەنوسێت

بە پێچەوانەوە ئەگەر لەو مەرجانەی ئێمە بۆی دادەنێین (OR) بەڵام فەکشنی

بەڵام ئەگەر هەموو مەرجەکان (TRUE) یەك مەرجی بێتە دی ئەوا دەنوسێت

نەهاتە دی واتە هەموو مەرجەکان هەڵە بوون ئەوا دەنوسێت (FALSE).

| | A | B | C |
|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەکان | فەکشن | ئەنجام |
| 2 | 1 | AND | TRUE |
| 3 | شێوازی نوسین | AND(A2=1,A2>0,A2<10,A2<50) | |

داناوەکە (**A2**)ئەگەر سەیری ئەم وێنەیە بکەین ئێمە چوار مەرجمان بۆخانەی وتومانە ئەم خانەیە یەکسانە بە (**1**) ،ئەم خانەیە گەورەترە لە (**0**)، ئەم خانەیە بچوکترە لە (**10**)، ئەم خانەیە بچوکترە لە (**50**).. ئەگەر ببینین ئەم خانەیە لە گەڵ هەموو مەرجەکاندا دەگونجێت بۆیە راستەوخۆ نوسراوە (**TRUE**).

| | A | B | C |
|---|---|---|---|
| 1 | ژمارەکان | فەکشن | ئەنجام |
| 2 | 5 | AND | FALSE |
| 3 | شێوازی نوسین | AND(A2=1,A2>0,A2<10,A2<50) | |

ئەگەر سەیری ئەم وێنەیە بکەین دەبینین لەو چوار مەرجەی کە بۆ خانەکەمان داناوە سیانیان هاتووەتە دی بەلام یەکێکیان نە هاتۆتە دی ئەویش ئەوەیە دەڵێت ئەم خانەیە یەکسانە بە (**1**)، بەلام لە خانەکەدا ژمارە (**5**) داخڵ کراوە کە .

(**FAISE**)یەکسان نیە بە (**1**) بۆیە راستەوخۆ نوسراوە

## ...فەکشنی (AND)و(IF)Fuction...

وەك لە پێشەوە باسی هەردوو فەکشنەکەمان کردووە و چۆنیەتی بەکارهێنانیانمان رون کردۆتەوە، لەم بەشەدا باس لە بەکارهێنانی ئەم دوو فەکشنە دەکەین بەیەکەوە.

سـوودی بەکارهێنانی ئەم دوو فەکشنە:-

ئێمە کە ئەم دوو فەکشنە بەیەکەوە بەکاردێنین بۆ ئەوەی کە لە یەك مەرج زیاتر ناکرێت وە نوسینی تێکست (IF)لەسەر خانەکان دابنێین کەئەم کردارە بە فەکشن ناکرێت.(AND)و ئەنجامدانی کرداری بیرکاری کەبە فەکشنی

واتە ئێمە فەکشنی (AND)&(IF) بەیەکەوە بەکاردێنین بۆ ئەوەی لە یەك مەرج زیاتر لەسەر خانەکان دابنێین.

بشێوازی بەکارهێنانی ئەم دوو فەکشنە بەیەکەوە:-

1/ بەکارهێنانی ئەم دوو فەکشنە بەیەکەوەتەنها دەبێت راستەوخۆ لە ناو خانەکەدا بینوسین واتە بەرێگاکانی تر نابێت.

2/ بەم شێوازە فەکشنەکە لەناو خانەکدا دەنوسین

**=IF(AND(A1>10,A1<20),"A1+20","**هیچ برێك وەرناگرێت")

واتە ئێمەلەم فەکشنەیاوتوومانە ئەگەر خانەی (A1)ە بەینی ژمارە (10)تاوەکە(20) دابێت ئەوا ئەم خانەیە کۆبکەرەوە لەگەڵ(10) ئەگەر وانەبوو ئەم تێکستە بنوسە.

نموونە:-

ئەگەر ئێمە نمرەی خوێندکارانمان هەبێت وە بمانەوێت ئاستەکانی خوێندان دیاری بکەین (کەووتوە، پەسەندە،ناوەندە، باشە ،زۆرباشە، نایابە) دیاری بکەین بەیەکەوە ئەم کارە ئەنجام دەدەین. (AND,IF)ئەوا دەبێت بە هەردوو فەکشنی

| | A | B | C | D |
|---|---|---|---|---|
| 1 | زنجیرە | ناو | نمرە | ئاست |
| 2 | 3 | بریار | 10 | کەوت |
| 3 | 7 | زیاد | 101 | هەڵەیە |
| 4 | 9 | شالاو | 80 | زۆرباشە |
| 5 | 10 | شیروان | 75 | باشە |
| 6 | 6 | کاروان | 50 | پەسەندە |
| 7 | 2 | کازاد | 98 | نایابە |
| 8 | 8 | هەردی | 87 | زۆرباشە |
| 9 | 4 | هەرێم | 76 | باشە |
| 10 | 5 | هێمن | 54 | پەسەندە |
| 11 | 1 | ئاریان | 45 | کەوت |

ئەمەش شێوازی نوسینی فەکشنەکە لەناو خانەکەدا:-

```
=IF(AND(C2>=0,C2<50),"کەوت",IF(AND(C2>=50,C2<60),"پەسەندە",IF(AND(C2>=60,C2,70),"ناوەندە",IF(AND(C2>=70,C2<80),"باشە",IF(AND(C2>=80,C2<90),"زۆرباشە",IF(AND(C2>=90,C2<
100),"نایابە","هەڵەیە"))))))
```

## ...فەکشنی (SUM IF) Fuction...

ئەم جارە باسی فەکشنێکی گرنگ ئەکەین لەم بەرنامەیەدا کە چەند کارێکی باشی پێ ئەنجام دەدەین. ئەم فەکشنە پێك هاتووە لە تێکەڵ کردنی دوو فەکشن کە لە پێشەوە هەردووکیانمان باس کردووە.

**SUM/1** :- بەکاردێت بۆ کۆکردنەوەی خانەکان.

**IF/2** :- بەکاردێت بۆ دانانی مەرج لەسەر خانەکان.

**SUM IF*** :- بەکاردێت بۆ کۆکردنەوەی خانەکان بە پێی مەرج.

واتە ئەم فەکشنە چەند خانەیەك کۆدەکاتەوە بەڵام بەپێی ئەو مەرجەی کە ئێمە بۆی دادەنێین.

چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم فەکشنە:-

**1/** لەو خانەی دەمانەوێت ئەم فەکشنەی تێدا بەکاربێنین نیشانەی یەکسان دادەنێین، بەیەکێك لە ڕێگاکان فەکشنەکە دەهێنینە ناو بەرنامەکەوە.

**2/** فەکشنەکە لە سێ بەش پێك هاتووە:-

**A_ range** :- لەم بەشەدا ماوەکەدیاری دەکەین کە مەرجی لەسەر

**B_ Criteria** :- لەم بەشەدا مەرج بۆخانەکەمان دادەنێین بەس دەبێت مەرجەکە

لە بەینی دەبڵ کۆتەیشندا("") بینوسین.

**C_ Sum_range** :- لەم بەشەدا ئەو ماوەیەدیاری دەکەین کەبۆمان کۆبکاتەوە.

نموونە:-

ئەگەر ئێمە دوکانێکی فرۆشتنی میووەمان هەبێت بمانەوێت بزانین لە هەریەکێك لەو میوانە بای چەندمان فرۆشتووە ئەوا ئەم کارە بەم فەکشنە دەکەین.

| | A | B | C |
|---|---|---|---|
| 1 | زنجیرە | ناوی میوە | بری پارە |
| 2 | 1 | هەنار | $ 79.00 |
| 3 | 2 | سێو | $ 20.00 |
| 4 | 3 | شووتی | $ 40.00 |
| 5 | 4 | هەرمێ | $ 12.00 |
| 6 | 5 | هەنار | $ 60.00 |
| 7 | 6 | شووتی | $ 56.00 |
| 8 | 7 | سێو | $ 93.00 |
| 9 | 8 | هەرمێ | $ 34.00 |
| 10 | 9 | هەنار | $ 45.00 |
| 11 | 10 | سێو | $ 21.00 |

| بری فرۆشتن | | | |
|---|---|---|---|
| هەنار | سێو | شووتی | هەرمێ |
| $184.00 | $ 134.00 | $96.00 | $46.00 |

=SUMIF(B2:B11,"هەنار",C2:C11) =SUMIF(B2:B1,"سێو",C2:C11) =SUMIF(B2:B11,"شووتی"C2:C11) =SUMIF(B2:B11,"هەرمێ"C2:C11)

## سەرنج

ئەگەر ئێمە بمانەوێت کردارەکە بگۆڕین بەجۆرێك خانەیەك دیاری بکەین لە ناو ئەو خانەیەدا ناوی ج میوەیەکمان نوسی راستەوخۆ بری پارەی ئەو میەویەمان پێبلێت. ئەم کردارەش ئاسانە لە جێگای مەرج دانانەکە لەجیاتی ناوی شتومەکەکە بنوسین ئەم شێوەیە دەنوسین (ناوی خانەکە&"=").

**=SUM IF (A1:A10,"="&C2,B1:B10)**

لەم کاتەدا لە خانەی(C2) دا ناوی ج شتومەکێ بنوسین بری پارەی ئەو شتومکە مان پێدەڵێت

.

## ...فەکشنی Fuction (COUNT IF)...

ئەم فەکشنە گرینگیەکی خۆی هەیە لەم بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ دا ئەم فەکشنەش لە یەگرتنی دوو فەکشن پێکدێت کە هەردوو فەکشنەکەمان لە پێشەوە باس کردووە.

**1/COUNT**:- بەکاردێت بۆ ژماردن.

**2/IF**:- بەکاردێت بۆ دانای مەرج.

**COUNT IF*** :- واتە بیژمێرە ئەگەر (واتە بیژمێرە بەپێی ئەو مەرجەی ئێمە بۆی دادەنێین).

چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم فەکشنە:-

**1**/ سەرەتا نیشانەی یەکسان دادەنێین و بەیەکێك لە ڕێگاکان فەکشنەکە دەهێنینە ناو پرۆگرامەکە.

**2**/ ئەم فەکشنە لە دوو بەش پێکدێت:-

**A- Range** :- لێرەدا ئەو ماوەیە دیاری دەکەین کە دەمانەوێت بیژمێرین.

**B- Criteria** :- لەم بەشەدا ئەو مەرجە دەنوسین کە بەپێی ئەم مەرجە خانەکان مان بۆ بژمێرێت.

نموونە:-

ئەگەر ئێمە پرۆژەیەکمان هەبێت ڕەگەزی کەسەکانی تێدا بێت بمانەوێت بزانین چەند کەس نێرە و چەند کەس مێ یە ، ئەم کارە بەم فەکشنە دەکرێت.

| | A | B | C | D | E | F | G | H | I |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | زنجیرە | ناو | ڕەگەز | | | نێر | مێ | | |
| 2 | 1 | محمد | نێر | | | 6 | 4 | | |
| 3 | 2 | ئاکام | نێر | | | | | | |
| 4 | 3 | ئاری | نێر | | | | | | |
| 5 | 4 | کاروان | نێر | =COUNTIF(C2:C11,"نێر") | | | =COUNTIF(C2:C11,"مێ") | | |
| 6 | 5 | مریم | مێ | | | | | | |
| 7 | 6 | هەریم | نێر | | | | | | |
| 8 | 7 | شێنێ | مێ | | | | | | |
| 9 | 8 | کامران | نێر | | | | | | |
| 10 | 9 | هێشوو | مێ | | | | | | |
| 11 | 10 | روناک | مێ | | | | | | |

**سەرنج**

**ئە گەر ئێمە بمانەوێت کردارەکە بگۆڕین بەجۆرێك خانەیەك دیاری بکەین ناوی چ شتێکمان نوسی ڕاستەوخۆ ئەو شتەمان بۆ بژمێرێت، ئەم کردارەش ئاسانە لەو بەشەی مەرج دادەنێین لە جیاتی ناوێك بنوسین ، ناوی خانەکە دەنوسین.**

**COUNT IF (A1,A10,C2)**

**ئێستا ئەگەر لەو خانەیەدا چی بنوسین ڕاستەوخۆ ژمارەی ئەوەمان پێدەڵێت.**

## ...فەكشنی (NOW&TODAY) Fuction...

ئەم جارە باسی دوو فەكشنی گرنگ دەكەین كە راستەوخۆ پەیوەندیان بە بەروارو كاتی كۆمپیتەرەكەی خۆمانەوە هەیە، كە راستەوخۆ لەگەڵ گۆرانی كات و بەرواری كۆپیتەرەكەماندا ئەمانیش گۆرانكاریان بەسەردا دێت.

**1/ TODAY**:- ئەم فەكشنە وەك ماناكەی خۆی واتە ئەمرۆ بەنوسینی ئەم فەكشنە لەناو خانەكەدا راستەوخۆ بەرواری ئەمرۆمان پێ نیشان دەدات.

**2/ NOW** :- ئەم فەكشنە وەك ماناكەی خۆی واتە ئێستا بەنوسینی ئەم فەكشنە لەناو خانەكەدا راستەوخۆ بەرواری ئەمرۆ و كاتی ئێستامان پێ نیشان دەدات.

| | A | B |
|---|---|---|
| 1 | TODAY | |
| 2 | 9/16/2013 | |
| 3 | | |
| 4 | | |
| 5 | | |
| 6 | | |
| 7 | | |

| | A | B |
|---|---|---|
| 1 | NOW | |
| 2 | 9/16/2013 11:22 | |
| 3 | | |
| 4 | | |
| 5 | | |
| 6 | | |
| 7 | | |
| 8 | | |

## کـۆتـــــای:-

خوێنەری ئەزیز و خۆشەویست لیرەدا کۆتای بەم کتێبە دەهێنین هەر چەندە هەندێ شتی ترماوە کە باسیان بکەین بەڵام من هەوڵم داوە زۆربەی ئەو بابەتە گرنگانە باس بکەم کە ئیشمان پێیان دەبێت وە هەروەها ئەگەر کەسێك سەرەتای بێت لە فێربونی ئەم بەرنامەیە ئەوا زۆر بە ئاسانی لە بابەتەکان دەگات.

هەروەها هیوادارم بمبورن لە هەر هەڵەیەك کە کردبیتم لەم بوارەدا جا لە باسکردنی بابەتەکاندا بێت یان هەر هەڵەیەکی تر بێت چونکە هەموو کەسێك ئەگەری ئەوەی هەیە هەلە بکات لە هەر کاتێکدا بێت.

بۆ هەر رەخنەو پێشنیارێك پەیوەندیم پێوە بکەن

**HARDYKANABY@YAHOO.COM**

**FACEBOOK.COM/HARDY KANABY**

بۆبینینی وانەی فێرکاری بەڤیدۆ لەسەر ئەم بەرنامەیە

**YOUTUBE.COM/HARDY KANABY**

نــــووسەر: هەردی کانبی

زانکۆی سلێمانی – بەشی ژمێریاری

قۆناغی یەکەم